زنجیرەی چیرۆکە قورئانیەکان

(١)

# کەشتی رزگار بوون

ن/عاطف عبدالرشید

و/ زانا کریم

بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی زنجیره: زنجیرەی چیرۆکە قورئانیەکان

ناوی پەرتوک: کەشتی رزگاربوون

نوسینی: عاطف عبدالرشید

وەرگێرانی: زانا کریم

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

تایپ و دیزاین: کۆمپیوتەی یاد

ژمارەی سپاردن: ژمارەی (١٣٨٠)ی ساڵی (٢٠٠٩)

لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی (مەحوی)

هەولێر/بازاری رۆشنبیری





بسم الله الرحمن الرحيم

# دەستپێک

خــوای گــەورە و میهرەبــان دروســتکاریئەم بونەوەرەیــە، و بەڕێوبەری هەموو ئەو شتانەیە کە لە ناو ئـەم بونەوەرەدایـە ، وە ئاگاداریــشە بەســەر هەموویانــدا، لـەقورئانی پـیرۆزدا چــەندین بەسەرهات و چیرۆک هاتووە کە بـاس لـە دەســەڵات و گـەورەیی خوداوەند دەکەن، بەو شێوەی کە خوای گەورە هەرشـتێکی بوێـت دەیکات، بە جۆرێک کە فەرمانی پێکرد ببە (کن) ئـەویش یەکـسەر دەبێت (فیکون).

کەشتی پێغەمبەر نوحیش (سڵاوی خوای لەسەر بێـت) یەکێکـە لەو چیرۆکانەی کە قسە ئەکات دەربارەی دەسەڵاتی خوای گـەورە، وە هەواڵمان پێ ئەدات کە چۆن خـوای بەدەسـەڵات بـێ بـاوەڕانی لەناو بردوو نوقمی ئاوی کردن، وە لە بەرامبەریـشدا ئیمانـدارانی رزگار کرد و سەرفرازی دونیا و دوارۆژی کردن، ئالەم پەرتووکـەدا دەزانین و فێـردەبین بەسـەرهاتی نـوح و پەنـد و ئامۆژگـاری لـێ وەردەگرین، وە ئەم چیرۆکە بۆمان روون دەکاتەوە کـە دەسـەڵاتی خــوا چــەندە گــەورە و فراوانــە وە بۆمــان روون دەکاتــەوە کــە ســەرفرازی و براوەیــی و بەختــەوەری تــەنها لــە گوێڕایــەڵی خــوای گەورەدایە...

# پیاوە چاکەکان

خوای پەروەردگار مرۆڤی دروست کردووە، وە تەنها ئـەویش ڕێــزی لــێ نــاوە، بــە جۆرێــك كــە بــەڕێزی كــردووە بەســەر دروســتكراوەكانیدا، وە نــاز و نیعمــەتێكی زۆری ڕشــتووە بەســەر ئادەمیزاددا،چ بە نهێنی بێــت یــاخود بــە ئاشــكرا، وە پــەروەردگار هەموو كات چاكەی دەوێت بۆ بەندەكانی و، دەیەوێت بــە تــاك و تــەنهایی بیپەرســتین و بــە چــاكیش بیناســین، خــوای بالآدەســت دەفەرموێت:

﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ الذاريات (٥٦)

واتە: بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نەكردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت كە من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن.

وە پێغەمبەر ئادەمیش ئەم ڕاستییەی دەزانی بۆیە خۆی و منداڵەكانی تەنها خوایان دەپەرست، وە لە ژیانیاندا هیچ هاوتاو هاوەڵێكیان بۆ خوا بڕیار نەدا، تا ئەوەی كە مردن و گەڕانەوە بۆ لای خوای خۆشەویست، پاش (١٠) سەدە دوای ئادەم (سەلامی خوای لێبێت) پێنج پیاوچاك و پیاوباش هەڵكەوتن كە پێیان دەوترا:

{١. وەد ، ٢. سوواع ، ٣. یەغوس ، ٤. یەعوق، ٥. نەسر}

ئەمانە لە ناو خەڵكی ئەو سەردەمەدا ناسراو بوون بە كەسانی



خواناس و پارێزکار و بەندانی چاکی خوای گەورە، وە هەموو خەڵکی ئەوانی خۆشدەویست و گوێڕایەڵی ئەوان دەبوون و هەموو کات شوێنکەوتەی ئەوان دەبوون، بەڵام لە ناکاودا روداوێکی دڵتەزێن روی دا لە ناو خەڵکیدا، ئەویش بریتی بوو لە مردنی هەر پێنجیان، خەڵکی بە مردنی ئەوان زۆر بێ تاقەت و پەرێشان و غەمباربوون.

## بت پەرستی

شەیتان لە کاتی مردنی ئەو پیاوە چاکانەدا بە فرسەتی زانی و خەتەرە و خەیاڵی خراپی کردە ناو دڵەکانیانەوە و فەرمانی پێکرد کە بچن پەیکەر لە شێوەی ئەو پێنج پیاوچاکەدا بتاشن بۆ ئەوەی هەرگیز ئەوانیان لە بیر نەچێتەوە و هەموو کات لە بەرچاویاندا بێت، ئەوانیش وەسوەسەکەی شەیتانیان قبوڵ کرد و لەسەر شێوەی ئەو پیاوچاکانەدا پێنج پەیکەری گەورەیان دروست کرد، لەسەرهەر یەکێ لەو بتانەش ناوی یەکێ لەو پێنج پیاوە چاکەشیان نوسی، رۆژ بەرۆژ هێواش هێواش شەیتان بەرەو گومڕایی دەبردن، هەروەکو چۆن وەختی خۆی ویستی ئادەم و کوڕەکانی گومڕا بکات هەر بەوشێوەیەش دەیویست خەڵکی ئەو ناوچەیەش گومڕا و سەرلێشێواندن بکات، وە دەیویست بیانبات بەرەو رێگای بێباوەڕی و هاوەڵدانان بۆ خوای گەورە، چونکە پێی وابوو کە ئادەم بوو بە

هۆکاری ئەوەی کە خوا لە رەحمەت و میهرەبانی خۆی دووری خستەوە، لە کاتێکدا خۆی بە گەورە زانی و سوجدەی بۆ ئادەم نەبرد، پەروەردگاریش پێی فەرموو: ﴿قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ﴾ الحجر (٣٢)

واتە: ئەی ئیبلیس ئەوە بۆ لەگەڵ کڕنووش بەراندا نیت؟

بەڵام شەیتانی خۆی بە زل زان لە وەڵامدا وتی: ﴿قَالَ لَمۡ أَكُن لِّأَسۡجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقۡتَهُۥ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ﴾ الحجر (٣٣)

واتە: من ئەوەندە (نزم و بچوک) نەبووم کڕنووش بەرم بۆ بەشەرێک کە تۆ دروستت کردووە لە قوڕێکی وشک کە پێشتر قوڕێکی رەشباو و ترشاو بووە؟!

بەم شێوەیە پەروەردگاریش لە رەحم و بەزەیی خۆی دووری خستەوە و دەری کرد و پێی فەرموو ﴿قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ٣٤ وَإِنَّ عَلَيۡكَ ٱللَّعۡنَةَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ الحجر (٣٤-٣٥)

واتە: کەواتە دەرچۆ چونکە بەڕاستی تۆ نەفرین لێکراویت، بەڕاستی نەفرینی خوات بەردەوام لەسەرە هەتا رۆژی دوایی.

ئالێرەدا شەیتان بەڵێنی دا هەرچی نەوەی ئادەم هەیە هەڵیان خەڵەتێنێ و لە خشتەیان بەرێت و رێگای راست و رێگای چاکیان لێ ون بکات، تەنها کەسانی دڵسۆز و بۆ خوا سوڵحاو نەبێت کە ناتوانێت بەسەریاندا زاڵ ببێت، پەروەردگارمان بۆمان دەگێڕێتەوە کە شەیتان وتی ﴿قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ﴾

الحجر (٣٩-٤٠)

واتە: ئیبلیس (بە بوغز و حەسادەتەوە) وتی: پەروەردگارم، مادەم بە هۆی ئەو ئینسانەوە منت سەرلێشێواو کرد شەرت بێت لە زەویدا هەموو گوناه و لادان و تاوانێکیان لا جوان و شیرین کەم و هەر هەموویان سەرلێشێواو و سەرگەردان بکەم، بێجگە لە بەندەدڵسۆز و پوختەکانی خۆت نەبێت (چونکە دڵیان بە باوەڕ بە تۆ و بە یادی تۆ ئاوەدانە، هەوڵ و کۆششی من بۆ وێڵ کردنیان ناکامە).

بەم شێوەیە شەیتان چوو بۆ لای ئەو گەلە و رۆژ بە رۆژ وەسوەسە و خەیاڵی خراپی دەخستە دڵەکانیانەوە، بە بەڵگەی ئەوەی دەیوت: ئەمانە کەسانێکی پیاوچاک بوون و کردەوەکانیان زۆر چاک بووە و هەرگیز لە ژیانیاندا سەرپێچی خوایان نەکردووە و تەنها خوایان پەرستووە و، بەندایەتییان تەنها بۆ ئەکرد، وەکو بڵێی

شەیتان خەریکی ئامۆژگاری خێر بوو بۆیان، بەڵام لەژێر ئەو وەسوەسانەیدا چەندین مەبەست و نیازی گڵاو و پیسی هەبوو، وە لە راستیدا لە رێگای ئەو وەسوەسە و خەتەرانەیەوە چەندین دەرگای شەڕ و خراپەی بە رووی ئەو خەڵکەدا کردەوە، تاکو گومڕایان بکات و وایان لێ بەسەر بهێنێت کە سەرپێچی خوای گەورە بکەن، سەرپێچییەکی زۆر زۆر گەورە کە ئەویش شەریک و هاوەڵ دانان بۆ خوا، پاش ئەوەی خەڵکی پەیکەرەکانیان لە سەر شێوەی پیاو چاکەکاندا دروست کرد زۆر کات هەبوو سەردانی ئەو پەیکەرانەیان دەکرد لە لای پەیکەرەکاندا دادەنیشتن و هەموویان دەکەوتنە باسی ئەو پیاو باشانە، وە قسەیان ئەکرد لە بارەی ئیمان و خواناسی و پارێزگارییانەوە، بەم جۆرە ئەو خەڵکە ماوەیەکی زۆر لەسەر ئەم شێوازە بەردەوام بوون، پاش ئەوەی ئەم کۆمەڵە مردن و دونیایان بەجێهێشت، شەیتان هەر وازی لەو قەومە نەهێنا و هەموو کات دەیویست وایان لێبکات کە هاوەڵ بۆ خوا دابنێن، ئەوە بوو کاتێک منداڵ و نەوەکانیان گەورە بوون ئەوان زیاتر و زیاتر رێزیان لە پەیکەرەکان دەگرت و بەگەورەیان دادەنان، لەم کاتەدا شەیتانیش بە هەلێکی زۆر چاکی زانی و خەتەرەو خەیاڵی دەخستە ناو دڵەکانیانەوە و پێی دەوتن: باو و باپیرانتان ئەم پەیکەرانەیان دەپەرست بۆیە پێویستە ئێوەش وەکو ئەوان بیانپەرستن و زیاتر لەوان رێز و قەدریان بگرن.

ئالێرەوە خەڵکی دەستیان کرد بە پەرستنی ئەو پەیکەر و بتانە، ئا ئەمەبوو بۆ یەکەم جار بت پەرستی لەسەر زەویدا کرا و بۆ یەکەم جار غەیری خوا بە خوا زانرا و سوجدەی بۆ برا، هەموو خەڵکەکە کە لە رێی وەسوەسەکانی شەیتانەوە ئەو پێنج پەیکەرەیان کرد بە هاوەڵی خودا و گومانیان وابوو کە بەندایەتی کردن بۆ ئەم بتانە هۆی نزیک خەرەوەیانە لە خوای گەورە، بۆیە هەموو کات کڕنوش و سوجدەیان بۆ دەبردن و بە چوار دەوریاندا دەسوڕانەوە و تەوافیان دەکردن و هەرچی ئاژەڵی چاک و باش بوایە بۆیان دەکردن بە قوربانی، چونکە بە گومانی خۆیان پێیان وابوو چاکەکردن بەرامبەر ئەم پەیکەرانە هۆی نزیک بوونەوەیانە لە خوای گەورە.

رۆژ بە رۆژ شەیتان زیاتر دڵی خۆش دەبو پێیان، وە هەموو کات هەوڵی دەدا زیاتر خۆشەویستی و گەورەیی بتەکان لەناو دڵیاندا بچێنێت، ئەم کارەیشی کرد و تیایدا سەرکەوتوو بوو، بە جۆرێک کە خەڵکەکەی هێنایە قەناعەت و بیروباوەڕێک کە بۆچونیان وابوو کە نەخێر ئەم پەیکەرانە خوا گەورەکانن و هەموو کار و بارێک بەدەست ئەمانەیە، مردن و ژیان، رزق و خێر و شەڕ و... هەمووی لە لایەن ئەمانەوە فەرمانی بوونی یان نەبوونی دەدرێت.

وە بە وەسوەسەکانی پێی دەوتن: ئەم پەیکەرانە دەتوانن هەموو بەڵاو موسیبەتێک بگەڕێننەوە و ڕەددی بکەنەوە، وە هۆکاری نەبوونی هەر بەڵایەک لە چاکەی ئەمانەوەیە.

بەم شێوەیە ئەو خەڵکە دەستیان دایە بتپەرستی ئەو پێنج پەیکەرە و شەو و ڕۆژ بە دیاریانەوە خۆیان خەریک دەکرد بە کڕنوش و سوجدە و لاڵانەوە و پاڕانەوە لێیان، وە هەرچی خواردنی خۆش و بەتام ببوایە دەیانهێنا و لە بەردەمی ئەواندا دایان دەنا، وە هەرچی ئاژەڵی چاک و باشیان چنگ بکەوتایە دەیانهێنا و لەبەردەمی ئەم بتانەدا دەیانکرد بە قۆچی قوربانی.

ئاوا بەم جۆرە شەیتان فێڵی لێ کردن و گومڕایی کردن و لە خوای تاک و تەنها و بێهاوەڵ وێڵی کردن.





# یەکەم نێردراو

پاش ئەوەی خەڵکەکە بەم شێوەیە دەستیان کردە پەرستنی غەیری خوا خوای گەورەش پێغەمبەرێکی بۆ ناردن کە ناوی (نوح)بوو سڵاوی خوای لێ بێ، ئەم پێغەمبەرە بانگی کردن بۆ ئیمان هێنان و پەرستنی خوای تاك و تەنها، وە بانگی دەکردن تاوەکو هاوەڵ و هاوتا بڕیار نەدەن بۆ پەروەردگار، و فەرمانی پێ ئەکردن کە دوور بکەونەوە لە سوژدە بردن بۆ ئەو بتانە و خۆیان بەدوور بگرن لە قوربانی کردن بۆیان و تەواف کردن بەدەوریاندا، وە هەموو کاتێ پێی دەوتن:

﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ۝٢ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ۝٣ يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُؤَخِّرۡكُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُۚ لَوۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾

نوح (٢-٤)

واتە: ئەی قەوم و هۆز و گەلم من بێگومان بێدار کەرەوەیەکی ئاشکرام بۆتان، داواتان لێ دەکەم کە هەر خوا بپەرستن و لە خەشم و قینی خۆتان بپارێزن و فەرمانبەرداری منیش بن، ئەو کاتە خوا لە گوناهەکانتان خۆش دەبێت و دەتانهێڵێتەوە بۆ کاتێکی دیاری

کراو، بێگومان کاتی دیاریکراوی خوا وەختێك پێش دێت، بە هیچ شێوەیەك دواناکەوێت ئەگەر بتانزانیایە.

بەم جۆرە نوح هەموو کات سوور بوو لەسەر ئەوەی کە لە بێباوەڕی و نەزانی دەریان بهێنێت و بیانبات بەرەو ڕێگای ڕزگاری و سەرفرازی، وە ئەو هیچ شتێکی لەوان نەدەویست تەنها خێر و چاکەی ئەوان نەبێت، وە زۆر بە سۆز و نەرم و نیانی و میهرەبانی گفتوگۆی لەگەڵ دەکردن و، بە هەموو هۆکار و ڕێگایەك بانگی دەکردن و زۆر بە پەرۆشییەوە پێی دەوتن ﴿يَـٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَـٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ﴾ الأعراف: ١٥٩

واتە: ئەی گەل و هۆزم ئێوە هەر خوا بپەرستن، چونکە جگە لەو زاتە خوایەکی ترتان نییە، بەڕاستی من دەترسم لە ڕۆژێکی گەورەدا توشی بەڵاو سزایەکی زۆر سەخت ببن.

وە نوح پێغەمبەر سڵاوی خوای لێبێت لەناو ئەو خەڵکەدا ناسراو بوو بە کەسێکی دەست پاك و ڕاستگۆ و ئەمین، وە هەرگیز داوای ماڵ و سامان و پلە و پایەی لێ نەدەکردن لە بەرامبەر ئەو قسە خێرانەدا کە بۆی دەکردن، بەڵکو دروشم و ئامانجی تەنها و



تەنهایی تەنها خوا بوو، دەیفەرموو ﴿وَيَـٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ
مَالًاۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۚ﴾ هود (٢٩)

واتە: ئەی خزمەکانم (خۆ من) لە بری ئەم بانگەواز و ئامۆژگارییانەم داوای هیچ ماڵ و خەرجیتان لێ ناکەم، کرێ و پاداشتم تەنها لای خوایە.

وە پێغەمبەر نوح سلاوی خوای لێبێ هەموو کات هانی دەدان کە بیر بکەنەوە لە دروستکراوەکان، تاوەکو بۆیان ئاشکرا ببێت کە هەموو شتەکان کەسێک هەیە دروستی کردوون و بەڕێوەیان دەبات، وە هەموو کات پێی دەوتن:

بیر بکەنەوە لە بونەوەر و ئەوەی تێیدایە بە چەندین شێوە و شێواز، دەیویست وایان لێبکات کە بە عەقڵ و ژیری و بیرکردنەوەی زۆریان خوای تاقانەیان پێ ئاشنا بکات، وە پێ دەفەرموون:

﴿مَّا لَكُمۡ لَا تَرۡجُونَ لِلَّهِ وَقَارٗا ﴿١٣﴾ وَقَدۡ خَلَقَكُمۡ أَطۡوَارًا ﴿١٤﴾
أَلَمۡ تَرَوۡاْ كَيۡفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗا ﴿١٥﴾ وَجَعَلَ ٱلۡقَمَرَ
فِيهِنَّ نُورٗا وَجَعَلَ ٱلشَّمۡسَ سِرَاجٗا ﴿١٦﴾ وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ
نَبَاتٗا ﴿١٧﴾ ثُمَّ يُعِيدُكُمۡ فِيهَا وَيُخۡرِجُكُمۡ إِخۡرَاجٗا ﴿١٨﴾ وَٱللَّهُ

جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ بِسَاطًا ﴿١٩﴾ لِّتَسْلُكُوا۟ مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا﴾ نوح (١٣-٢٠)

واته: ئەوە چیتانە ئێوە قەدری خوا نازانن، بۆ ڕێزی بۆ دانانێن و لێی ناترسن خۆ ئێوە پێشتر نەبوون، هەر خوا خۆی بە چەند قۆناغدا ئێوەی تێپەڕاند و دروستی کردن، ئایا سەرنجتان نەدا چۆن خوا حەوت چین ئاسمانی دروست کردووە؟! مانگی کردۆتە روناکی تیایاندا و خۆریشی داگیرساندووە، هەر خوا ئێوەی لە خاکی زەوی بەدیهێناوە و پێی گەیاندوون.

پاشان دەتانمرێنێت و دەتانخاتەوە ناوی، هەرکاتیش بیەوێت دەرتان دەهێنێتەوە، هەر ئەو خوایە زەوی بۆ راخستوون (چۆنتان بوێت و بۆچیتان بوێت بەدەستانەوە دێت) تا بە (ئارەزووی خۆتان) پیایدا بگەڕێن لە ڕێگە فراوانەکاندا.

ئابەم شێوە جوانە، بەم قسە گەورە و بەنرخانە بانگەوازی دەکرد بۆ لای خوای گەورە، چونکە نوح ئەوەی دەزانی کە تەنها خوا شایەنی پەرستن و قوربانی بۆکردنە، وە دەیزانی هەموو دروستکراوەکانیش موڵکی ئەو خوایەن و پێویستە هەمووشیان هەر خوا بپەرستن.

# بێباوەڕی و سەرسەختی

پێغەمبەر نوح (سلاوی خوای لێبێت) بەردەوام بانگی گەل و هۆزەکەی دەکرد بۆ پەرستنی خوای تاک و تەنها و خۆدوور خستنەوە لە هاوەڵ و شەریک قەراردان بۆی، بەلام ئەوان پشتیان دەکردە نوح و گوێیان نەدەدا بە قسە بەسوود و پڕ واتاکانی، لە هەر شوێنێکیشەوە نوحیان بدیبایە رایان دەکرد و لێی دوور دەکەوتنەوە، پۆشاکەکانیان دەدا بەسەر و چاویاندا و دەستەکانیان دەخنییە ناو گوێکانیانەوە و روویان وەردەگێڕا لە نوح تاوەکو بەقسەی خۆیان وازیان لێ بهێنێت، بەلام پێغەمبەر نوح سلاوی خوای لێبێت هیچ کات بێ ئومێد نەبوو لە هیدایەت دانیان، بۆیە شەو و رۆژی خسبووە سەر یەک و لە ئاشکرا و لە نهێنیدا بانگی دەکردن بۆ لای خوا و، خەڵوەتی لەگەڵ پەروەردگاردا دەکرد و دەیفەرموو ﴿رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا ۝٥ فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَاءِي إِلَّا فِرَارًا ۝٦ وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوا أَصَابِعَهُمْ فِي ءَاذَانِهِمْ وَاسْتَغْشَوْا ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّوا وَاسْتَكْبَرُوا اسْتِكْبَارًا ۝٧ ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ۝٨ ثُمَّ إِنِّي أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا﴾ نوح ٥-٩

واتە: پەروەردگارا من بە شەو و بەڕۆژ بانگی قەوم و گەلەکەم کرد (بۆ یەکخواناسی و پارێزکاری) کەچی بانگەوازەکەی من هیچی زیاد نەکرد، تەنها راکردنیان نەبێت، بەڕاستی من هەموو جارێك کە بانگەوازم دەکردن تا لێیان خۆش ببیت، پەنجەیان دەخستە گوێچکەیانەوە تا نەبیستن، جلەکانیان بەسەر خۆیاندا دەدا تا نەمبینن، زۆر گەرم بوون لەسەر بێباوەڕی و خۆیان بەزل دەزانی و لوتبەرز بوون، پاشان من بە ئاشکرا بانگم دەکردن و (وتارم بۆ دان)، ئینجا من بە روونی و بێ پەردە هەموو شتێکم بۆ باس کردن، هەندێ جاریش بە نهێنی قسەم بۆ دەکردن (تاکە تاکە و خێزانەکانیان).

بەم شێوەیە نوح لەسەر ئەم حاڵ و بارەی بەردەوام بوو،وە هەر بانگی دەکردن بۆ خواناسین، بە بێ هیچ دوودڵی و بێ ئومێدییەك (٩٥٠) ساڵ بانگی کردن بۆ پەرستنی خوای گەورە، وە هەر کاتێك گەلەکەی روویان لێ وەرگێڕایە ئەو کۆمەڵێك رێگاو هۆکاری تری ئەگرتە بەر، تاوەکو وایان لێ بکات ئیمان بهێنن بە خوای تاقانە، زۆر بە میهرەبانی و بەسۆزی گفتوگۆی لەگەڵدا دەکردن، زۆر بە هێمنی و لەسەرخۆییەوە لەگەڵیاندا هەڵسوکەوتی دەکرد، چونکە دەیزانی ئەرکی سەرشانی بریتییە لە شارەزا کردنیان بۆ سەر رێگەی جوان و بڵندی ئیسلام، وە دووریان بخاتەوە لە پەرستنی بتەکان و، نزیکیان بخاتەوە لە خوای میهرەبان



و بەندایەتی کردنی تاك و تەنهایی بۆ ئەو، بەڵام ئەوان ڕۆژ بە ڕۆژ بێ باوەڕی و کەللە ڕەقییەکەیان زیادی دەکرد و هەموویان کۆدەبوونەوە و بەرامبەر بەو پێغەمبەرە دڵسۆزە رادەوەستان و دوژمنکارییان بەرامبەر دەنواند و گاڵتەیان پێ دەکرد، وە هەمووکات لەگاڵتەکانیاندا پێیان دەووت: ئەو کەسانەی کە شوێنکەوتەی تۆن و ئیمانیان بە تۆ هێناوە کەسانی لاواز و هەژار و داماون، وە هیچ کەسێکی دەوڵەمەند و خاوەن ڕێز و پلە و پایە دوای تۆ ناکەوێت، وە دەوڵەمەندەکان پێیان دەوت:

﴿مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِىَ ٱلرَّأْىِ وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍۭ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَٰذِبِينَ﴾ هود ٢٧

واتە: ئێمە تۆ تەنها وەك یەکێك لە خۆمان دەبینین و نابینین ئەوانەی شوێنی تۆ کەوتوون جگە لەوانەی کە هەژار و داماوەکانمانن و دووربین نین و ژیریان کەمە و سادەن، هەروەها نابینین ئێوە هیچ شتێکی زیاترتان بەسەر ئێمەدا هەبێت، بەڵکو ئێمە واگومان دەبەین ئێوە درۆزنن.

پاشان ئەو کۆمەڵە بێباوەڕە داوایان لە نوح کرد کە ئەو فەقیر و هەژارانە لە خۆی دوور بخاتەوە و دەریانبکات، پێغەمبەر نوحیش پێی وتن:

﴿وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ الشعراء ١١٤

واتە: من هەرگیز ئیمانداران دەرناکەم و (دڵیان نائێشێنم)

بەم شێوەیە بێباوەڕان هەموو کات نوحیان تۆمەتبار ئەکرد بە قسەی ناشرین و بێ مەعنا، جارێک پێیان دەوت ئەمە گومڕایە

﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ الأعراف ٦٠

واتە: دەستەی دەسەڵاتداری قەومەکەی وتیان: بەڕاستی ئێمە تۆ لە نێو گومڕاییەکی ئاشکرادا دەبینین، وە جارێکیش تۆمەتباریان دەکرد بەوەی کە کەسێکی درۆزنە، یاخود کەسێکی شێتە، بەڵام پێغەمبەر نوح (درودی خوای لەسەر بێت) هەموو کات ئارامی دەگرت لە بەرامبەری هەموو قسە ناخۆشەکانیاندا، تەنانەت هاوسەرەکەی خۆی بە خەڵکی دەوت بڕوای پێ مەکەن چونکە کەسێکی ناتەواوە و من زانام بە نهێنیەکانی، وە هەر کاتێکیش بیزانیایە کەسێک ئیمانی پێ هێناوە خێرا دەچوو بۆ لای و پێی دەوت پاشگەز بەرەوە چونکە نوحی هاوسەرم کەسێکی ناتەواو و شێتە وە تەنانەت کوڕەکەی خۆی ئیمانی پێ نەهێنا و باوکی بە ناتەواو دەدا لە قەڵەم...

بەم شێوەیە ڕۆژ بە ڕۆژ کەلە ڕەقی و دوژمنایەتییان بەرامبەر بەو پێغەمبەرە خۆشەویستە زیادی دەکرد و زیاتر دڵ ڕەقتر دەبوون بەرامبەری، پێغەمبەر نوحیش (سڵاوی خوای لەسەر بێت) خەریک بوو بێ هیوا و بێ ئومێد دەبوو، پەروەردگاریش نیگای بۆ کرد و پێی فەرموو ﴿وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلَّا مَن قَدْ ءَامَنَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ﴾ هود (٣٦)

واتە: (سەرەنجام) وەحی و پەیامی خوا ڕەوانە کرا بۆ نوح کە چاک بزانە بەڕاستی هەرگیز کەسیتر بڕاوا ناهێنێت لە قەومەکەت جگە لەوەی کە بەڕاستی ئیمانی هێناوە، کە وابو خەفەت بار مەبە بەو کردەوە ناشرین و ناپەسەندانەی ئەنجامیان دەدا.

ئەوە بووو بەم شێوەیە نوح هەر چەندێ قسەیبۆ دەکردن و ئامۆژگاری دەکردن هیچ سوود و قازانجێکی نەبوو، تا ئەوە بوو هەڕەشەی کوشتن و بەردبارانیان لێ کرد ﴿قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَـٰنُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمَرْجُومِينَ﴾ الشعراء (١١٦)

واتە: وتیان ئەی نوح ئەگەر کۆڵ نەدەیت و کۆتایی بەم باسانە نەهێنیت بەڕاستی لە ڕەجم کراوان دەبیت و (بەردبارانت دەکەین).

ئەوە بوو پێغەمبەر نوحیش (سلاوی خوای لەسەر بێت) نزای کرد و فەرمووی ﴿رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا۟ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓا۟ إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴿٢٧﴾ رَّبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِىَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّـٰلِمِينَ إِلَّا تَبَارًۢا﴾ نوح (٢٦-٢٨)

واتە: پەروەردگاراهیچ کەسێک لە بێ بڕوایان لەسەر زەویدا مەهێڵە و تۆویان ببڕە، چونکە بەڕاستی ئەگەر تۆ وازیان لێ بهێنیت هەرچی بەندەکانی تۆیە گومڕای دەکەن و کەسیشیان لێ نابێت (لە نەوەی تازە) مەگەر خراپەکار و تاوانکار نەبێت، پەروەردگارا لە خۆم و دایک و باوکم و ئەوانە خۆشببە کە دێنە ماڵم بە ئیمان و باوەڕەوە، هەروەها لە ئیماندارانی پیاو و ئیماندارانی ئافرەتیش خۆشبە، ستەمکارانیش تەنها تیاچوون نەبێت هیچی تر نەکەیتە بەشیان.

# دروست کردنی کەشتیەکە

پاش نزاکەی نوح کە داوای کرد لە خوای گەورە کە بێ بڕوایان لەناو ببات پەروەردگاریش فەرمانی کرد بە نوح کە کەشتییەکی گەورە دروست بکات لە تەختە و دار، وە لە هەموو دروستکراوێك نێر و مێیەکی تێبکات، نوحیش گوێڕایەڵی فەرمانەکەی پەروەردگاری کرد و لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە بڕوایان پێ هێنابوو دەستیان کرد بە دروست کردنی کەشتییەکی گەورە تا ئەوەی لێبوونەوە، پاشان لە هەموو دروستکراوێك نێرو مێیەکی تێکرد، لەم کاتەدا بێبڕوایان ئەهاتن و پێدەکەنین بەم ئیشەی نوح و گاڵتەیان پێ دەکرد و بەسوکایەتی کردنەوە دەیانوت ﴿يَـٰنُوحُ قَدْ جَـٰدَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَـٰلَنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ﴾ هود (٣٢)

واتە: ئەی نوح بەڕاستی زۆر لەسەری چوویت و زیاد لە پێویست بەربەرەکانی و شەڕە قسەت لەگەڵدا کردین دەی ئەو سزایەمان بۆ بهێنە کە هەڕەشەی پێ دەکەیت و هەمیشە باسی دەکەیت و دەمانترسێنی پێی، ئەگەر تۆ لە راستگۆیانی.



# لافاوەکە

**ئێستا کاتی سزای خواییە بۆ ئەو نەتەوە سەر سەخت و بێ باوەڕە، پەروەردگارمان فەرمانی کرد بە زەوی کە ئاو فرێبداتە دەرەوە و ئاو برژێنێتە سەر زەوی، وە فەرمانی کرد بە ئاسمان کە باران ببارێنێت، بەم شێوەیە سزای خوا هات بۆ ئەو قەومە و ئاو لە ئەرز و ئاسمانەوە بە لێزمە و بە خوڕڕەم دەهاتە دەرەوە و دادەباری زۆر بە توندی، تا ئەوە بوو هەموو ماڵ و کۆڵان و شوێنەکانیان پڕ بوو لە ئاو، ئەوسا وردە وردە ئاوەکە لە زەوی بەرز بوویەوە و کەشتیەکەش زیاتر بەرز دەبوویەوە کە نوح و ئیماندارەکان هەموویان لە ناویدابوون، لەم کاتەدا نوحی میهرەبان کوڕەکەی خۆی بینی لە ناو کۆمەڵە شەپۆلێکی ئاودا گیری خواردبوو خەریک بوو دەخنکا، بۆیە هاواری لێکرد و فەرمووی** ﴿ٱرۡكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ **هود (٤٢)**

**واتە: رۆڵەگیان لەگەڵ ئێمەدا سواربە لەگەڵ بێباوەڕاندا مەبە.**

**بەڵام کوڕەکەی لەم کاتەشدا هەر سوور بوو لەسەر بێباوەڕی و خۆ بەزل زانین بۆیە وتی** ﴿سَـَٔاوِيٓ إِلَىٰ جَبَلٖ يَعۡصِمُنِي مِنَ ٱلۡمَآءِ﴾ **هود (٤٣)**

واتە: پەنا ئەبەمە لای ئەو چیایە و دەمپارێزێت لەم زریان و ئاوە، نوحی بەسۆزیش زۆر خەمی بوو بۆیە وتی:

﴿لَا عَاصِمَ ٱلْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ﴾ هود (٤٣)

واتە: (رۆڵەگیان) ئەمڕۆ هیچ پەنادەرێك نییە لە تۆڵە و خەشمی خوا کەس بپارێزێت مەگەر کەسێك خوا خۆی رەحمی پێ بکات.

پاشان ئەوەبوو ئاوەکە ئەوەندە بەرز بوویەوە کە هەرچی کەژ و کێوەکانیش هەبوو داپۆشی و کوڕەکەی نوحیش چووە ریزی خنکاوەکانەوە و مرد، ئەوسا نوح کە کوڕەکەی بینی بەو شێوەیە سۆز و بەزەیی جوڵا و وتی:

﴿رَبِّ إِنَّ ٱبْنِى مِنْ أَهْلِى وَإِنَّ وَعْدَكَ ٱلْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ ٱلْحَٰكِمِينَ﴾ هود (٤٥)

واتە: ئەی پەروەردگارم کوڕەکەم لە خێزانی من بوو، بێگومان پەیمانی تۆش راستە و تۆش زاناترین و دادپەروەرترینی فەرمانڕەوایانیت.

پەروەردگاریش وەڵامی دایەوە و فەرموی:



﴿يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيۡسَ مِنۡ أَهۡلِكَۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيۡرُ صَٰلِحٖۖ فَلَا تَسۡـَٔلۡنِ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۖ إِنِّيٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ﴾ هود (٤٦)

واته: ئەی نوح بەڕاستی ئەو لە خێزانی تۆ نەبوو، چونکە بەڕاستی ئەو کرداری چاک نەبوو، کەوابوو داوای شتێکم لێ مەکە کە زانیاریت لە بارەیدا نییە، بێگومان من ئامۆژگاریت دەکەم کە کارێک نەکەیت خۆت بخەیتە ریزی نەفامانەوە.

خێرا نوحیش داوای لێبوردنی لە خوا کرد و وتی:

﴿رَبِّ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِكَ أَنۡ أَسۡـَٔلَكَ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞۖ وَإِلَّا تَغۡفِرۡ لِي وَتَرۡحَمۡنِيٓ أَكُن مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ هود (٤٧)

واته: ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من پەنا دەگرم بەتۆ کە داوای شتێک بکەم زانیاریم پێی نەبێت، خۆ ئەگەر لێم خۆش نەبیت و بەزەییت پێمدا نەیەتەوە ئەوە دەچمە ریزی خەسارەتمەندانەوە.

دوای ماوەیەکی کەم خوای باڵادەست هەموو کافران و بێبڕوایانی لەناو برد و نوقمی ژێر ئاوی کردن، وە ئیماندارانیشی پاراست و رزگاری کردن،



پاشان له لایەن خواوە فەرمان کرا بە زەوی و ئاسمان و پێیان وترا:

﴿يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ وَقِيلَ بُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾

هود ٤٤

واتە: ئەی زەوی ئاوەکەت با رۆبچێتەوە بە ناختدا، ئەی ئاسمان: تۆش با بەس بێت و باران مەبارێنە، ئیتر ئاوەکە رۆچوو، فەرمانیش بەرێکی و تەواوی ئەنجامدرا، کەشتیەکەش لەسەر کێوی (جودی) (کە لە کوردستانی باکورە) وەستاو لەنگەری گرت، وترا: دەک دووری لە بەزەیی خوا و تیاچوون بۆ بەرەی ستەمکاران.

پاشان پێغەمبەر نوح و هەموو ئیماندارەکان دابەزینە سەر ئەو زەوییە و هەموو گیاندارەکانیشیان داگرت و ژیانێکی تازەیان دەست پێکردەوە،ژیانێکی پڕ لە خۆشی و بەختەوەری و، دوور لە بێبڕوایان و ستەمکاران و، پڕ لە برایەتی و دادپەروەری و خۆشگوزەرانی، ژیانێک کە تەنها خوای تێدا دەناسرا و غەیری خوای تێدا بە هیچ دادەنرا.

پەروەردگارا ژیانی خۆش و پڕ لە هیواش ببەخشیت بە ئێمە و، بمانپارێزیت لە خەڵکانی ستەمکار و زاڵم و، هەردەم ئاینی

ئیسلام لە هەموو شوێنێک سەرکەوتوو و باڵادەست بکەیت..

آمین... آمین

وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ

٨/٤/٢٠٠٩

والسلام عليكم و رحمة الله





# زنجیرەی چیرۆکە قورئانیەکان

1- کەشتی ڕزگار بوون — چاپ کراوە

2- ووشترە خواییەکە — چاپ کراوە

3- یارانی ئەشکەوت — چاپ کراوە

4- گەنجینەکانی قاروون — چاپ کراوە

5- گوێرەکە ئاڵتونیەکە — چاپ کراوە

6- کێوە باڵگرتووەکە

7- خاوەن فیلەکان

8- پەپوی چاکەکار

9- خوانە ئاسمانیەکە

10- مانگا سەیرەکە

چاوەڕوانی بەشەکانی تری ئەم زنجیرە یەبن .

انشاءالله

ئێمەش چاوەڕوانی دوعای خێرتانین .

# زنجیرەی چیرۆکە قورئانیەکان

١- کەشتی ڕزگار بوون — چاپ کراوە

٢- ووشترە خواییەکە — چاپ کراوە

٣- یارانی ئەشکەوت — چاپ کراوە

٤- گەنجینەکانی قاروون — چاپ کراوە

٥- گوێرەکە ئالتونیەکە — چاپ کراوە

٦-كێوە باڵگرتووەکە

٧-خاوەن فیلەکان

٨-پەپوی چاکەکار

٩-خوانە ئاسمانیەکە

١٠-مانگا سەیرەکە

---

**چاوەڕوانی بەشەکانی تری ئەم زنجیرەیە بن**

**ئیمەش چاوەڕوانی دوعای خێرتانین.**

E-mail-faqezana@yahoo.com

